ناوی کتێب : داد و ناڵە
بابەت : شیعر
نووسینی: عیرفان عەوداڵ
تایپ و بەرگ : هۆشمەند عەبدوڵڵا حەمک
نەخشەسازی : کۆمپیوتەری هیوا
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم / ٢٠١٦
چاپ : چاپخانەی رۆژهەڵات / هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٦٤٩)ی ساڵی ٢٠١٦ ی دراوەتێ

## شتێک بۆ پێشەکی ...

قەڵەمەکەم ماندووە. چەند جارێک شکاوە
بریندار بووە وایلێهاتووە ئیدی وەڕزبێت لێم
بیرمە جارێکیان،
سیگاری بۆ ڕاداشتم. ئەوکاتەبوو کە یار،
تاڵی لێوەشاندبووم
قەڵەمەکەم یەخەی کراسەکەی دادڕی،
بۆ مەرگی براکەم
دڵنەوایی باوکمی کرد و باوەشی بە دایکما کرد.

سوپاس بۆ چاوەکانت، کە ئەیبڕییە ،
گەشتی زامم...

"عیرفان عەودالْ"

# داد و ناڵە

لە فیراقی عیشقی تۆدا
داد و ناڵەم چی بەسەر دێ

لە کانگای کیشوەری دڵتا
ئەبێ دییەی منی لێبێ

لە دەست زوڵم و ستەمی زۆر
حاڵی حازر چیم بەسەر دێ

لە داووی زوڵفی شێوە ڕەشماڵت
دەوای دەردم ئەبێ چیبێ

بە هەقیانەت هەقت دەوێ
دڵ بەڕاستی تۆی خۆش دەوێ

تۆش ڕەهام کە لە کۆت و بەند
گەر شیعری جوانت دەوێ

٢٠١١/٤/٣
هەولێر

# وەهار

ئاور وە ماڵم وەسڵی وەهارە
سنجری سینەم عەینەن گرکانە

ئەها وەهڵم هەس ئەیاری گیانی
خانەم کەلاوەو ئاوەزە بەد فامی

بێ هیوا و غەریب سەمەندەر ئاسا
تەمەنم ساواق ئاسکۆڵ گوڵ ئاسا

بەلاغی دڵم پڕ لە تانە و سۆ
ماجەڵانیرم شادیم شین و ڕۆ

٢٠١٦/٨/١٠
**هەولێر**

# لەشکری خەم

وا هات جەیشی خەت سەرتاپا سپی
ڕووی ڕەشی نەما هەمی هەڵوەری

هەر بە جەوری جەرخی گەردوون
ڕۆژی ڕووناکیم بوو بە تیرەگین

خانەی دڵ ڕووخا بوو بە خار و خەس
سەراپای ژینم بووە بە قەقنەس

چەمم زۆربەی کات پڕ ئەشک بووە
زۆری تەمەنم جورعەنۆش بووە

تەمەن بە سەر چوو لییەم پیر بووە
خۆشیم نەبیوە گشتی ڕۆشتووە

لە حاڵی غەرغەرەدام نیە ڕزگارم
بۆ سەحرایی مەحشەر نیە وەڵامم

٢٠١٠/٥/٦
**کفری**

# هیچ نالێم لای یار

باسی حاڵم ناکەم لای یارم ئێستا
زووێر ئەبێ بزانێ چی وا لەم دڵەیە

لەتاری خاتیرات و ناڵە و سرووشک
تا هیستە ڕێئەکەم تا نەزانێ بە خەووشم

دوایی واهی ئەبێ بە عزابی حەیاتم
کە بزە و گرووشمە وتابانی یار پەرییێ

دەنگی ئاواز و شێوە و بۆنی گوڵ ئاسا بێ
مینا گەرد و شەکر خەندە هەمی شتێکی قابیلە

نیاز مەبە بە سپەر بۆ ئەم جەستە واهیە
لە کاتی ئیحتیزارم خەم مەخۆ با نەناڵم

٢٠٠٩/١١/٢٨
دووەم ڕۆژی جەژنی قوربان.
هەولێر

## دەبوو تێبگەی

من عامیری ئەم قەرنەم
شەیدای ئادگاری ئەو کێوانەم

تەزەرووی دڵ تەنیا بیری ژیانە
ئارووز و ژانی دڵ تورەیی عالەمە

بە دەست نەزانی و بێ عیرفانیمان
کەووتوین بە دوایی تەنخواهـ هەموومان

کێ هەیە تەن فوسوردە نەبێ
لەم ژیانەدا تەنگ خواردوو نەبێ

بەسە ئیتر بەزمی هەوەس
با وازبێنین لە خودی لاجلەوس

٢٠١٤/٢/٣
خانەقین

# تیرە باران

یا ئەبێت بە حاکم و تیرە بارانم دەکا
بەو چاوە پڕ لە عیشوەی مەست و بێ هۆشم دەکا

وا بە زولفی پایزی گرد وەرزم خەزان دەکا
بە بەژن و باڵای تووبایی چاو بۆ نەزەر خۆش ئەکا

بە لار و لەنجەی رەعنایی پیاو عازێوبارندەکا
بە فریوودانی دڵی تاوانبارانم دەکا

وا بە لووفزی شیرینی ئاشنای قەنارەم دەکا
بەو دڵە پڕ لە قینەی وا تووشی زەخمم دەکا

٢٠١٦/٢/١٠

**هەولێر- مەسیف**

# تاوەنبار خۆم

ڕەنگ زەرد و مات و خەجاڵەت
تاوانباری دەرگای خوا ی خۆم

هێزی دەست و ئەژنۆم شکا
بێ هۆشی ڕێگایی خوای خۆم

لە میحرابی میر خاساندا ڕووم وەرگێڕا
بێ پەنا و بێ جێگا خۆم

بووم بە هاوەڵی شەیتان و..
زەرەر مەندی هەر دوو لا خۆم

وا بووم بە کۆیلەی نەفس و
ڕەفتاری چاکەم لێنایە

بیر و هۆشم وا تێکچووە
بەد کاری و تاوان لە خوێنمایە

تا هەنگاوێکم بۆ خێرە
هەزار هەنگاوم تاوانە

پەنا ئەگرم بە خوای گەورە
لەسەر ئەم هەموو تاوانە

٢٠١٥/١٠/٤
دەربەندیخان

## بەسە

بەسە ئیدی خۆ دەرخستن
تاکو کەی بێت خۆ دوور خستن

سووتام بە چەوگانی زولف
وەفای نەبوو چەرخی چەرخ

فەرد خۆت نەکرد بە غەمزەدا
منیش لە گەڵتم بە دڵێکی کەسەر

بە داد و ناڵە بە زامێکی سەخت
سوور هەڵگەڕاووم وەک لولەی تفەنگ

نابینم ئێستا کەمان ئەبرۆکەت
لە گیانەلاییدام با ببینم ڕووت

٢٠١٠/٤/٣
**هەڵەبجە**

# خێوەتگە

لە دووای خێوەتگەی عیشقەوە
لە دووای بێ هیوا بوونی دڵەوە

لە شارێکی بێ ڕووناکی و دوورە پەرێز
بۆ گوڵێکی بۆن نەکردووی زۆر بەڕێز

ئەم ئێستاکە ڕووم کردۆتە دەشت
ئەیرژێم دەردی دڵەی پەست

بۆ ئادگاری سرووشتی هەردەم گەش
بۆترووسکەیێک بۆ ڕووناکی دڵەی ڕەش

ئەما مەغز لەدەست نا ئومێدی
لە چاوەڕوانی ئەو دییە پەری

تا ماوم لەش لەت لەت ئەمێنێ
تا لە قەشەنگی یار تیا ئەچێ

٢٠٠٧/٧/٦
موصل - کۆشکی صەدام حسین

# خونچەدەم

لە دەست ڕوو گرژی وەهار
بۆ چیە ئاخ و دەرد و هاوار

کە ئەو ڕووخساری منی نەوێ
ناوێرم ڕوو وەرگێرم بۆ تاوێ

ئاخ عاطیر جان سەیرێک بکە
هەر نا سەیری خاطیری من کە

ئەی ئادەمی تەمکینی جوان
ئەی جوانی مەسلەک بەرز و ناب

بەسە عیشوەی پادشایەتی
خونچە دەم وەرە با بۆ یەک بین

٢٠١٦/٤/٢٣
کەلار

## چارشێو

لایدا چارشێو لەسەر ڕووی ماهی
بەلەرکەووت گۆیی چاهی زەنەخدانی

وا دیارە قوببەی سینەی وەکوو ئەڵماسی
بەرپایکرد قیامەت قامەت یاری ئاس

تیری برۆی پێکای دڵی شێواوی عەوداڵ
بە لێشاوو دێت زەخم و مەینەتی و پاسقاڵ

ئەم ئێستاکە گوزەشت گوفتاری نۆشی شاهیدم
ئەبێ کەی بێت دلبەرم لایبات خەمی نێو دڵەکەم

٢٠٠٧/٣/١٧

**موصل – سەربازگەی کەسک**

# نۆکەری

مەبە نۆکەر بە دووژمن
ببە نۆکەری وولاّت

سەر شۆڕ مەکە بۆ نانێک
هەتا ماویت لە ژیان

ژیان یەک دوو ڕۆژێکە
کۆتایی هەر نەمانە

بە مەردی بژی لە ژین
نەک بە پاشای بێگانە

ڕێز لە نیشتیمان بگرە
ڕێزن لای نیشتیمانە

لە کۆتایی خۆ ئەمریت
جەستەی تۆ نیشتیمانە

**٢٠٠٧/٧/٧**

**بەغداد – سەربازگەی بەسمایە**

# تەنیایی

ڕێگام هەمووی تەنیاییە و
بارگەم خەمی لە کۆڵناوە

ئاسەواری بەجێماوم
هەمووی بتێکی شکاوە

وا ماڵیشم وویرانەیە و
خامۆشی دەووری تەنیووە

هەنگاوەکانم خەمبارن
تەنیاییان زۆر بینیوە

٢٠١٢/٢٥/٦
بەربەندیخان

# خەون و ڕاستی

بێ ئاوەزە نەبووم لە ژین
ئاسکۆڵ بێ ئاوەزەی کردم

ڕاستیەکانم لا خراپ بوو
درۆکانم پەسەند دەکرد

تەمەنم خونچەی نێرگزبوو
کەچی لە ژێر پێی خۆی وون کرد

بە پیلانی دۆزەخیانەت
هەمووشتت بۆ خراپ کرد

زۆر بە سوک و بە سانایی
ژینی پەپولەیەکت پیس کرد

لە دونیایی خەون و ڕاستیدا
ماڵیَ ئێمەت بۆ وویران کرد

٢٠١٣/١١/٢٠
**تورکیا - ئەنقەرە**

# گرفتار

من کە بە زولفی یار گرفتارم
ئەڵێی ئەسیری بەعسی زۆردارم

مەڵێن عەوداڵ فکری زۆرە
بە تەواوی تەسلیمی دەستی یارم

ڕاستە لە پشت هەق خوراووم
بە ناهەقیش داخورپاوم

وەکو مەنسورڕ نەکرام بە دارا
دەنا منیش لایەقی دارم

لە دووی ئاوازی جیهانم
ڕووم لە دەشت و پشت لە شارم

پەنا ئەگرم بە خوای گەورە
ڕزگارمکات لە دەست یارم

٢٠١٢/١٧/٨
سلێمانی

# بەسەر چوو

بەسەر چوو عومری گەنجیم
بە باچوو شێوەی جوانیم

نەمدیوە ساتێ خۆشی
گیرۆدەبووم لە پێناوی

کە هاتمە ناوای باڵای تۆ
تۆ بە باڵای من ڕازینەبووی

من زۆر بە پاکی تۆم خۆش وویست
تۆ بە درۆ خۆشت وویستم

بەڵێن ئەدەم لەم دونیایە
تا دووا نەفەس لێت دوور ئەبم

جارێکیتر نایەمەوە
وەکوو گوڵێک من ووشک ئەبم

ئیستا وا سەفەرم کردووە
بەرەو ووڵاتێکی نەهامەتی

ڕۆژانە نازانم چۆن دەژیم
شەوانەم چۆن تێدەپەڕێ

من تەنیا ئەوەندە ئەزانم
ڕۆژێک بە مەرگی خۆم شاد ئەبم

ڕۆژێک نوقمی نێو خوێناوو
ڕۆژێک لە نێو گۆڕا ئەبم

٢٠٠٨/٧/١٥
موصل: کۆشکی صدام حسین
ئەم شیعرە ڕاستەوخۆ ووتراوە بە تەلەفوو،
کاتێ لە گەڵ هاوڕێیەکم قسەم ئەکرد،
سوپاسی هاوڕێم: هۆشمەند عەبدوڵا ئەکەم،
کە ئەم شیعرەمی ڕێکۆرئکرد و پاراستی.

# سووتان

ئەناڵێنم بە دەست خەمی دەروێشیم
ئەسوتێم وەک پەروانە بۆ بێکەسیم

گشت تەمەنم لاعزی تالیع بووە
بۆ ساتێک چاو بێ ڕۆندک نەبووە

بەشێوەی سەری موو خۆشیم نەدیوە
ئەوەی هەمبووە بەس ڕەنجیش بووە

له هەموو ساتێکا دۆشنام بەشبووە
بەشی من فەقەد ڕەنج کێشان بووە

دەرناچم هەرگیز لە ژێر باری خەمم دا
چارە خۆگێرانە بە دەوری خەنجەردا

٢٠١٤/٩/١٢
دهۆک

# خۆ گێڕان

بناڵە بولبول غەزەل خوێنت چوو
بە خۆ گێرانی دەست و تفەنگ چوو

ئاهم ناڵەیە و سینەم سیا پۆش
مەیلم کز و مات ئاوەزەم بێ هۆش

دەستم بێ هێزە و دیدە پڕ ئەسرین
خوانم گشت جەرگ و پشتم گرد برین

تابانی ڕۆژم بوو بە خار و خەس
خاطیر لە سینەم بووە بە قەقنەس

شەوم پڕ شەوێ و بێ خەو و کەسەر
ڕەهاییم نیە لە سەحرای مەحشەر

٢٠١٦/١/٣
هەولێر- نەخۆشخانەی ڕزگاری.

## بۆ هاوڕێی پێشمەرگەم
## شەهید سەلمان

شەهید زامێکی وای لەسەر دڵم
لەبیرناکرێیت هەتاکوو ئەمرم

سەلمان ناوی تۆ ئێجگار گەورەیە
وەک چییای گولان سەر بەرزیت هەیە

بە فرمێسکی چاو بارانت هێنا
بە خوێنی سورت بەهارت هێنا

سڵاوی لە گیانی پاکی جوانی تۆ
تۆ نەمر ئەبیت هەر نەمری تۆ

٢٠١٥/٣/٢٥
هەولێر

# گریان

بەگریانەوە لە دایک بووم
گریان بەشمە تاکو مردن

خەفەت بارە ئەم دڵەی من
دوونیا بۆ لێم بوو بە دوژمن

یەک دوو خەندەی خۆشم بینی
ئەوەی دی هەمووی شیوەنە

خۆشی و شادی بۆ من خەونوو
وا بۆ خەڵکی تاجی سەرە

بێزاری لە دەرگای داوم
دەرگای هیوا ناکرێتەوە

ئەوەی راست و رەوان بدوێ
سیا رەش و خاک بەسەرە

٢٠١٤/٤/١٥
پێنجوێن

# ئۆباڵ بە ملم

لایدە پەچەکەت چاو ئەبرۆ کەوان
کردەت نەسووزێ هەر خۆمم نادان

تیخ بارانم کە با ببم نەجات
ئۆباڵ بە ملم بتکەم تاوانبار

زارۆکی ڕەبەن چیدابوو لە تۆ
بەلەنگاز بە ئۆک گەنجیم شین و ڕۆ

کردمت بە تانەی خزمو دۆستانم
مەرگ خۆشترە لەوەی لە ژیانم

٢٠١٦/٩/٢٦
**هەولێر**

# ئەگریجە

مەستت کردووم بە ئەگریجە و
یەخەت ئاوەڵا کردووە

لە بەخت و توێڵی کزۆڵمدا
هەموو شتت بۆ بردووە

ڕەحمێک بە ژینم ناکەی
وا دەزانی دیلی جەنگم

بێ ڕەحمانە کە تۆ خۆری
بۆ نازانی سەر پڕ بەفرم

وەکوو منداڵی هەتیوو بم
ئازارەکانی جەستەم ئەکەی

گوڵ و خونچە لە یەک ناکەی
بۆ بە یەک چاو سەیریان ئەکەی

٢٠١٠/٦/٢
**هەولێر**

# دڵنیابە

ئوورییەکەی من هەروەک بورکان
هەموو ناخت ئەسوتێنێ

یان وەک گەڵای زەردی خەزان
عومری گەنجیت ئەشێوێنێ

وائەزانی ئاهو وناڵەم
هەروا بەفیرۆ ئەچێ

دڵنیابە لە کۆتایی
هەموو ژینت ئەروخێنێ

٢٠٠٣/٩/٢٢
هەولێر

# کابووس

ئەی سوارچاکی خۆشەویستی
تۆزێک زووبەو بگە فریام

لە گێژاوی ژیانێک دام
زۆر سامناکە هەر بەتەنیام

ژیان کابوسێکە لای من
تۆقێنەرەو ئەم ترسێنێ

وا هەست ئەکەم دڵەی پاکم
ترپەی لێدانی نامێنێ

هەموو شەوێک روخسارێکە
خەو لە چاوم ئەتۆرێنێت

زۆر حەز دەکەم کاتێک هەستام
دەستم چاوم دەربهێنێ

بەڵام بەرۆشتنی ساتێک
دڵم ئەڵێت توخوا مەکە

گەر رەحم بە چاوت ناکەی
رەحمێک بەم دڵەت بکە

٢٠١١/١٢/٢

# سیمبولی ئەوین

کەی گوڵ لای من جوانی هەبوو
هەموو گولێک وەک یەک وابوو

هەرگوڵێک کە ئەمبینی
بێرەحمانە لەژێر پام بوو

بەڵام کاتێک کەتۆم ناسی
ئاشنات کردم بەگشت گوڵێک

لەو کاتەوە گوڵ و جوانی
بوون بەسیمبولی ئەوینێک

ئێستا من عەودالی گوڵم
گوڵیش عەودالی عەوداڵە

ئەگەر رۆژێک یەک نەبینین
دڵتەنگیمان پێوە دیارە

٢٠١٠/١٠/٢٠
**هەولێر**

# تەنیایی

لە تەنیای بێزارنابم
هەزارهێندە تەنیاتربم

لەگەڵ تەنیا بوم بە هاوری
ئەو ئەزانێ خەمی دڵم

هەر هاورێیەک کە ئەمبینێ
ئەڵێت عیرفان تۆ شێت بووی

بەس نازانێت لە ناخەوە
هەزار هێندە گەورە بووم

٢٠١١/١٠/٢٠
**هەولێر**

# عاشقه وون بووەکان

فریشتەکەم بێدەنگ ئەگری
منیش دڵم پڕ زوو خاوە

کانگای خەمە لەنێوو دڵم
خۆشیوو شادی تیا نەماوە

ئاروو بەردی ئەم وولاتە
ڕەشپۆشی خۆی وا دەنوێنێ

لەهەر سوچێکی ئەم شارە
چەندان ئاشقی تیا فەوتاوە

٢٠١٠/١١/٢١
هەولێر - شەوانی بێداری

## سەر و سیما

سەر و سیمام وا تێکچووە
ڕووی مەجلیسی گەنجم نیە

بەجارێک ژینم شێواوە
خۆ هیچ ئاگام لە خۆم نیە

وەک کەروێشکێکی دەستەمۆ
توانایی ڕزگار بوونم نیە

لە دووا وێستگەی تەمەنمدا
پرسە و ناسیاوم بۆ چییە

٢٠١٥/٦/١٧
**هەولێر**

# خۆ نواندن

بەسە ئیتر خۆ نواندن
خۆ نواندنت بێ فایدەیە

تۆ کە ڕیشیشت لێ زیادە
کردەوەی پیاواتیت کامەیە

باسی شەرەف و ناموس ئەکەیت
لە شەرەف و ناموسی خۆت لامەیە

بە جۆرێک زیندانت کردووم
مردن لە چاویا چش نیە

لێدان و جنێو و کووشتن
کاری نا مرۆڤانەیە

گەر تۆ ڕاستی و شەرەفت دەوێ
خوو ڕەوشت و شەرەفی خۆت
یەکسانەیە

٢٠١٣/١٩/٤
هەولێر – لە کرێکاریدا

# سەختیەکانی دوو هاوڕێ

ڕۆژگارێکی زۆر سفڵەیە جوان ئازاری ئاخمان ئەدات
شەوارەیە دەمانترسێنێت و گوێ بە خەمی دڵمان نادات

چەند شیعر و ئاوازی جوان بوو فرمێسکی دوانەی پێڕشتین
منداڵیمان چەندە جوان بوو بە ئەوینەوە گەورە بووین

ئەم ئێستاکە گەورەییمان ئاشووبێکی ترسناک و تۆقێنەرە
خۆزگە و ئاواتمان لێ وون بوو نائومێدی تاجی سەرە

دەست بۆ هەر کارێک ئەبەین لۆرانێک چاوەڕێیە
زۆر ئامەزرۆی تیشکی خۆرین کەچی هەر شەو لەگەڵمانە

ئێستا هاوڕێ تۆم خۆش ئەوێ پێویستیم بە هاوەڵی تۆیە
لە جاران زیاتر گرنگی ئەردە بڵێم هەر لای تۆیە

ئە تۆش دەست بخە نێو دەستم لەم ڕۆژگارە تەنیام مەکە
بەڵێنی هەقم بدەرێ و بە وەفابە و تا دوا وێستگە لە گەڵم بە

٢٠١٢/١٠/٢٩
بۆ هاورێی خۆشەویستم
هۆشمەند عەبدولا

# بێگانە وویستی یار

کە من مەست بە بادە نەبم، مەستم بە بینینی یارم
یاریش لە من بێ ئاگایە. کە بۆدووری پرسە دارم

کە دەپرسم لە ئەحواڵی یار، بۆچ بێدەنگ و بێ ڕەنگە
بەس لە من بێ ئاگا نیە. بێ ئاگاشە لە هەواڵی ئەم فەنەکە

تا یار لە زیندانیماڵبێ و، شەو و ڕۆژی هەر یەک چون بێ
گۆشەی تەنیایی بەرنادەم، تا تەنیایی لێم زیز دەبێ

تا ئەو کاتەی یاری نازدار، ڕاستیەکانی بۆ ڕوون دەبێ
بێگانەی لە کن دووژمن و منی لە لا ئاشنا ئەبێ

کەچی هەر من بێگانەمە، یار بێگانەی لا ئاشنایە
هەست بەم سۆزە گەورە ناکا، لە نێو خاکی دڵمدایە

هــەزار ڕەحمــەت لــە بــاپیرم قــسەیــەکــی زۆر ڕەوایــە،
خەم و چاکەت بۆ کەسێک بوو دۆزەخێکی لە گەڵدایە

٢٠١١/٨/١٥

# زیندانێکی وێرانکەر

کێ ڕێشتویەتی تاڵی ژیان
کێ چەشتویەتی ئەشکەنجە و ژان

کێ بەدەم خەمی شەوان بێدار بووە
کێ وەکوو من بەدیار ئاسمانەوە دانیشتوە

کێ بەردەوام ئەسرین لە چاوانی ڕژاوە
لە تەمەنی منداڵیەوە بە ئاوارە بانگ کراوم

کەس نەبووە بڕوا ناکەم کەسیش هەبێ
وەک دڵی عەودالٚ بێ ئارام بێ

هەروەک ئێستا لە ژوورێکی بێ چرا بێ
ئەم دڵەم کە لە سینەمدایە وا دەیبەستێ

لە باخی گوڵی بێ مروەت و پیاوی دوو ڕوو
تەمەنی من و وەک چرکەی سەعات زوو ڕابوو

٢٠٠٩/٣/١٥
زیندانی موصل – کۆشکی صدام حسین

# باسی یار

باس بۆتە باست لە نێو شار و دێ
منی بەد بەختیش هەڵناکەم لە وێ

لە نێو شار هەڵدێم ئەچمە ئەو شاخە
پیشەی ڕۆژانەم هەر ئاخ و داخە

هەروەک کەسێکی بێکەس و بێکار
ڕەنگ زەرد و زوویر دوور لە بەزمی یار

دوور لەو شەوانەی پڕ لە بەزمی خۆش
پڕ لە پێکەنین بە جۆش و خرۆش

ئیستاکە وا خەم شوێنی گرتووە
خۆشی جارانی لە دڵ دەرچووە

هێمای شاعیریم هەموو تەنیایە
تەنیایی خۆشە بەهەشتی خوایە

٢٠١٠/٨/١٤

# کچی لادێ

ئەوا وارانە نم نمەی جوانی
ئەبا لە باڵای کچی لادێ

وا هاتنە دەرێ لە کوچەی زیندان
بە خەندە و خۆشی بە جلێکی جوان

جوانی چی جوانی تەواوو سەرسام
لە شێوەی نیە لە وولاتی شام

ڕوو دەکەنە شاخ نێو گوڵ و گوڵزار
بە قسەی خۆش و دوور لە خەمی شار

سەیرە ئەو لێوە هەر وەکو سێوە
باڵای شمشاڵی ژینم بێ خەوە

کەمان ئەبرۆکەی دڵمی بردووە
چەوگانی زولفی تەنیایی کردوومە

ددانی ووردی شێوە برنجی
"بە شەرم و حەیا و ئاکاری چاکی"

"منیکردووە شێت و هێتی خۆی"
"وەختە لە داخا گیانم دەرچێ بۆی"

پاییزی ئێمە بەهاری جوانە
بەهاریش بە کچی لادێوە جوانە

وا ڕازایەوە دەشتی کوردستان
بە کچی لادێی جوان و خان و مان

چی لە شار بکەم لە کچی ئەوێ
چاو گێر و فێڵباز کوڕێکی ئەوێ

خاوەن سامان و پارە و عانە بێ
خانووی مەڕمەڕ و حەلانی دەوێ

ئۆتومبێلی جوان لەژێر پێی دابێ
موبایلی باش لە گیرفانیابێ

شەو تا بەیانی لە نێو بازاڕ بێ
کە گەڕایەوە خولاّم حازر بێ

ماڵی خاوێن و دوور لە کێشەبێ
هەموو هەفتەیەک ئارێشگای ئەوێت

زۆر جوانە لای من کیژی لادێیی
ئەو ئەیپارێزێت کەلتوری کوردی

شەرتە لە داخان ڕوو لە دەشت بکەم
هەر لەوێ کچێ بۆخۆم دیاری کەم

ئەگەر هەر چیبێ ڕووی لە من ئەبێ
نەک وەک کچی شار ڕوم لێوەرگێڕێ

بەفیدای ئەکەم گیانی پاکی خۆم
هەست و سۆزەکەی ناخی دڵەکەم

گەر ڕۆژێک هات و شۆڕش بەر پاکەم
لە کوردستاندا تا دووژمن دەرکەم

ئەوا من دەیکەم زۆر بە ئاسانی
لەبەر خاتری کچی لادێیی

ئەوان ئەزانن قەدری خوێنەکەم
بە گوڵی سورەوە ئەکەن یادەکەم

٢٠٠٩/٣/٢٢

# جاران

پیاومان شێر بوو
ئافرەتمان پیاو

شۆڕشگێڕ و قارەمان
چاو نەترس و بوێرانە

ڕوو بە ڕوو بوون لە سەنگەر دا
لە ئاست دوژمنی ئەم گەلە

ئامادەبوون گیانی پاکیان
یان کوردستان یان بۆ نەمان

هەزاران پێشمەرگەمان چوو
تا ئازادیمان بۆ بوو

چۆکیان بە دووژمن دا
ئاڵای کوردستانیان هەڵدا

**٢٠٠٧/٧/٢٠**
**بەغداد - سەربازگەی بەسمایە**

# زیندان

وا لە زیندان دام دەست و پێ بەندم
ئافەرین دنیا تۆڵەت لێ سەندم

زنجیری ئاسن کرایە دەستم
ڕووخساری گەنجیم تەواوو پیر کردم

دەرد و مەینەتی زۆرت پێ نۆشتم
هەروەکو بولبول لە قەفەست کردم

ئازادی باشە با من جوان بدوویێم
نەوەک لە زیندان بێدەنگ بڕزێم

٢٠١٠/١٠/١٥

**زیندانی موحەتە - هەولێر**

# گریانی دایک

مەگری دایە گیان گەر بێت و بمرم
زۆر دڵ خۆش ئەبم شادبم بە مەرگم

ئاوانە فرمێسکی چاوی جوانی تۆ
برژێ بۆ منی بێکەس بە بێ هۆ

تەنیا تۆم هەیە تۆی سەرچاوەی من
تۆی ئاسودەیی و شادی و خۆشی من

ئێستا وا ئەڕۆم گۆڕ چاوەڕێمە
گەردنم ئازاکە مەنزڵ لە ڕێمە

تۆی ژیان و گیان و جەرگ و دڵی من
تۆی هەموو کەسم تۆی ڕوناکی من

٢٠٠٨/١/٢٥
موصل - کۆشکی ڕەماح

## بێمروەتی تەمەن

ئەی تەمەنی سیا پۆشم
بۆ کوێ ئەڕۆیت بگە رێوە

ملی ڕێگات وا گرتووە
ئاوڕ لە دوا نادەیتەوە

من هەڵوەدام بە دوای تۆدا
کەچی تۆش لە من ڕا ئەکەی

قژی ڕەشمت وا سپی کرد
ئەتەوێ شێوەشم پیرکەی

بێمروەتی ئەی تەمەنم
بۆچی ئاوام بەسەر دێنی

زۆر دڵنیام وەکو گەنجیم
ڕۆژێک ژینم ئەشێوێنی

٢٠٠٨/٦/٢٠

موصل – نەبی یونس

# ئازارданی دڵ

ئاشقی ڕۆژی ڕووتم ئەمما
ئەکەی ئازاردانی دڵ

دڵ دیل و دەست بە سەرە
بۆچی ئەڵێی چیە دڵ

خۆمن لەسەر دینی تۆم
تۆش لەسەر دینی منی

خۆ نەبووم بە زولەیخا
بۆچی ئەمکەیت بە گاور

ئەوەندە زاڵم و زۆرداری
هەست ناکەی بە بوونی من

بەزەییت پێمدا نایە و
پێئەکەنی بە حاڵی من

٢٠١٢/٦/٧
دەربەندیخان

# گوڵی تەنیا

بە دڵ خۆشی هاتم بۆ لات
بە خەندەوە سڵاوم کرد

کەچی تۆش گوڵی تەنیام
بە تورەیی پێشوازیتکرد

نەمئەزانی سەبەب چیبوو
وا بەمجۆرە خۆت دوورەخست

ئەو چەند ڕۆژەی کە لەلات بووم
تەنیا ووشەیەکت نەگووت

ئەو پەرتوکەی بۆم کڕیبویت
لە کۆتایی داتەوە پێم

ئەو هێلانە حەزەی هەم بوو
بە دەستی خۆت سووتاندت لێم

لە تاوو خۆشی و ماڵی دنیا
دەپێم بڵێ بۆ ووات کرد لێم

٢٠١٠/٤/٢٩
**بناری بەمۆ**

# شێوەی یار

بسکی زەردی یارشێوە ئاڵتونی
برۆی شمشێریو ئاسکیوجوانی

برژانگی تیژی وەک نوکی دەرزی
ناویە لە دڵم خەندەی شیرینی

دەست و پەنجەی وورد بەژنێکی بچوک
بێچارەی کردووم یاری ئێسک سوک

٢٠٠٥/٩/٧

# خەون و خەیاڵ

خەون و خەیاڵ لای من ڕۆیشت
ئێستا خەم شوێنی گرتوە

هەر وەک گەڵای زەردی پایز
هەڵوەریوە ووشک بووە

هەرچەند دەستم دریژئەکەم
ناگەم بە خۆشبەختی ژیان

هەنگاوەکان لێم بێزار بوون
ڕێگا ئەبڕم بێ ناو نیشان

چارەنووسی ئەمڕۆم وایە
سبەی ئەبێ چی ڕووبدا

خوا ئەزانێ لە چ سوچێکدا
مەرگ خۆیم نیشان ئەدا

٢٠٠٧/٤/٢٥
**کەرکوک – سەربازگەی کەیوان**

# لێم ببورە

لێم ببورە ئاسکۆڵەکەم
بەبێ وەفا ناوت نەبەم

لە نووسینی هەندێ شیعرا
بە خراپە باست دەکەم

بە نووسینی شیعر نەبێ
قەت ناتوانم خەمم کەم

هەموو شەوێک بە تەنیایی
خەم لە تەنیایی ڕزگار ئەکەم

لێم ببورە تخوا گوڵم
گەر جار جارێک ناوت دێنم

شیعر بۆ جوانیەکەت نەبێت
نە ئەینووسم نە سەیری ئەکەم

٢٠٠٦/٨/٤
هەولێر

# هزری غەریبیم

فرمێسکی چاوانی ماندووم
وەکوو باران دادەباری

شەوێک نەبوو لە ژیانما
بە بێ قەراری تێپەڕێت

هەموو شەوێک بە بێداری
خەو لە چاوانم دەزڕێ

بۆ ئەم خاکە چکۆلانەم
داخوو فەرما چی بەسەردێ

بە دەست چ زۆردارێکەوە
سرووشتی جوانم ئەسووتێ

داد و ناڵەم هەر وا ئەبێ
تاکوو ماوم بێ کۆتایە

تەنیا ئەو خەمەی عەشقە نیە
لەنێو سینە و دڵم دایە

ئەها هەزاران خەمی ترە
هەر وەکوو من بێ نەوایە

وا بۆی ئەچم هەتا دەمرم
چارەسەرێ نیە ئەی خودایە

**٢٠١٤/٨/١٤- لە پێشمەرگایەتی دا – گوێڕ**

# شەپۆلی خەم

ئازاری دڵ شەپۆل ئەدا
وەکوو دەریا بێ ئارامە

ئەڵێی تەنیا دڵی منە
کە وا ئەژی لەم دنیایە

پاڵە پەستۆیی سەر دڵی من
ئەوەندەی زەوی قورس و گرانە

کفت و داماو و زەلیلم
دەرمانی دەردم مەحاڵە

ئازاردانی مێروولەیەک
وەکوو دەرهێنانی دڵم وایە

تا هەژارێک بوونی هەبێت
دڵخۆشی من بێ مەودایە

٢٠٠٧/٥/٢٣
کەرکوک-سەربازگەی کەیوان.

# سەراب و خەندە

لێم مەپرسە چۆن من ئەژیم
ژینم بێ تۆ بێ مانایە

وەک و گەڵای هەڵوەریوم
بە دەست خەمی ئەم دنیایە

ژیانی من پڕ سەرابە و
ژینی تۆش پڕ خەندەیە

ئاواتی زۆر لەسەر ڕێتە و
ئاواتی من تەنیا مەیە

خۆزگە کانت وەکو گوڵە
تازە چرۆی خۆی دەرئەکا

خۆزگەی منیش هەڵوەریوە
دڕک چووە بە نێویدا

هەق بەتۆیە خۆت دوور ئەخەی
خەم و خۆشی بە یەک ناگا

گرفتاری باڵای تۆم و
خوا ئەزانێ بۆ کوێم ئەبا

٢٠٠٦/١٠/١٢
سلێمانی

## بەرە بەیان

کە دێیتە دەر بەرەبەیان
بە نازەوە سەیرم دەکەی

لە نێو هەموو خوێندکارەکان
بە جوانیەکەت بانگم دەکەی

شەرم ئەکەم بێمە سەر ڕێت
تا پێت بڵێم خۆشم دەوێی

نەکا خوێندکارێک گوێی لێبێ
لە خوێندنگە ئابڕووت بەرێ

لێم ببورە گوڵی تاکم
کە بەم جۆرە بێزارتەکەم

گەر تۆ دڵی منت بوێ
من گیانی خۆمت پێشکەش دەکەم

٢٠٠٥/١٠/١٥
هەولێر

# لێم مەپرسە

لێم مەپرسە بۆچی ئاوا
دەروێشی گۆشەی ڕێگامە

بۆچی ئاوا بەم شێوەیە
پەشۆکاوی ئەم دنیا مە

لەم دنیایە هیچ کەسێ
بە وێنەی تۆ جوان نەبوو

هیچ کەسێکیش لە وێنەی من
ئاشقی بالاکەت نەبوو

کەسێک نەبوو لە شێوەی من
وەسفی جوانیەکەت بکات

لە خەما لەگەڵتا بێت
تا دوا خەم لە دڵت دەربکا

وا منتکرد بە دەروێش و
خۆشتکرد بە فریشتە

کە ئەمبینی لەسەر ڕێگاش
ئەڵێی خۆت لادە شێتە

هەق بە تۆیە وام لێ ئەکەی
ناز و مەکرم لەسەر ئەکەی

به جوانیەکەت خۆت شاز ئەکەی
له کۆتایی بۆ کوێی ئەبەی

هەروەک دڵی جارانی من
هەموو شتێک له ناو ئەبەی

دڵنیابه هەر وەکوو من
ژیانی خۆت ووێران ئەکەی

٢٠٠٨/٩/١٤
موصل – سەربازگەی کەسک

## ئاوەزە

ئاوەزە نەما لە سەرمدا
چون شاجوانێک پەسەند دەکات

شاجوانیش بە جوانی خۆیی
فیتنەی باشم بۆ ساز دەکا

بە ناز و مەکر و درۆکەی
ئەمڕۆ و سبەینێم پێ ئەکات

نازانم تاکەی بێ ڕەحمە
وەک تیمساڵێک سەیرم دەکات

دڵ داخورپا لە سینەمدا
کاتێک ڕاستی قبوڵ دەکا

لە دەست ژواری ئەو دیدە پەرییە
توامەوە وا لە داخان

٢٠١٠/٤/٦
هەولێر

# شاراوەی دڵ

دەزانی من لە بیرم نەکردووی
تا ئێستا هەرعەوداڵی هەواڵێکتم

دەزانی خەمی تۆ گەورە ترینە
تا ئێستا نەمتوانیوە قایل بم پێی

ئاسمان پڕ لە هەوری سپی بوو
منیش پڕ لە قەلەندەری ڕەش

ژیان تا توانی خراپ بو لەگەڵم
دڵیمن بە تەنگیەوە بەرگەی گرت

تۆ"ئای لە تۆ"هەرکە ناوت دێت
قولاب ئەچێتە ڕۆحمەوە دەیدڕێ

زوو هەڵدەچم خێرا خەیاڵ ئەچێتەوە
سەر شەقامو گەڕاندەکا بەدوات بتبینم

لەبیر خۆمیدەبەمەوە ئیستا خوێندکارێک
نیت وازت لە خوێندن هێنابێت کەسەکەم

ئێستا بێ ئەوەی چوبیت بۆ خوێندنگە
من چاوەڕێی گەڕانەوەت دەکەم ماڵەکەم

ئەو هاوژینەشتم خۆشدەوێ کە هەتە
ئیرەیی پێئەبەم خاوەنی تۆیە هـ.س.ن

ئەوەتە من ئاواش هەر خۆشم دەوێی
کێ گووتی: عاشق دەبێ بۆ یەک بێ؟

درۆییکرد ئەوەی گووتی:
عاشق دەبێت یەک سەرینی هەبێت

ئەوەتا من یەک، تۆ دوو، سەرینت هەیە
وەلی هێشتا عاشقم عاشقی دوو سەرینی

مەزانە وا ئەم قسانە بە بێباکی دەکەم
قەسەم دڵمەلرزێ، پەنجەکانم لارە لار

چونکە دڵمە ئەیبسێ تۆ تەرکی منت کرد
پەنجە ئەینووسێ شەق بەدەری منت کرد

٢٠١٦/١٠/٢
هەولێر

## ئەمڕۆ جەژنە

جه سته ی ماندووم
جگه له تارمایيه كی نامۆو
تيمسالێكی بێ ڕۆح
هيچی ترنيم
سه رم شۆڕكردۆته وه
له تاو ئه م هه موو خه مه دا
نابينام له جه نگه لخانه ی ژيانم دا
به م هه موو ويرانه ی ناخم
وێڵم به نێو كه لاوه رووخاوه كانی ته مه ن دا
وێڵم به دوای ووردوو خاشبونی دڵم دا
به دوای تنۆكه خوێنی ڕژاوی برينم دا

ئه مرۆ چه ژنه و
له ته واوی مه مله كه تی خۆشی
ته نیاو ته نیا شه قال شه قالی قامكم به دی ئه
كه م
له تویلَی كزۆلّم پشكوتی لۆچ پیّناس ئه كه م
له نێو جه نجالّی هاوسه نگه رانم دا
هه ست به ته نیای خۆم ئه كه م

٢٠١٦/٩/١٢
له پێشمەرگایەتیدا
گوێر- یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان.

# هەقیەتی دڵ

هەقیەتی دڵی قەقنەسم
کەدایم ئەکا باسی

چون تا ئێستا کەسێک نیە
لە شێوەی ئەسڵ و ئەساسی

یـــار بە عیشوەی
ئاوەزەو دڵمی سەرگەردانکرد

بەجۆرێک ژیینی لێ تێکدام
تا بە عەوداڵ ناوم دەرکرد

له نێو ئاروورزو ژواردا
تەواوو پیر و تەوەلابووم

له نێو خۆشی ئەو ژیانه
بە زەخموو دۆشنام ئاشنابووم

سەیره ئەوەندە ئازار بەخشی
کەچی هێشتا له دڵم دایت

بۆ هەر کوێیەک هەنگاو ئەنێم
وا هەست ئەکەم له گەڵمدای

٢٠١٣/٣/١٢
سلێمانی

# گوڵی جوانی

گوڵی جوانی نێو باخچەکەم
ڕەنگ زەردی خۆی ئەنوێنێ

لە بەرئەوەی لۆکەکەی من
دەستی نەرمی پیا ناهێنێ

سەیرە بۆچی گوڵەکانم
وا هۆگری دەستەکانتە

ئەگەر ڕۆژێک تۆ نەبینی
زۆر شێواوو کز و ماتە

دار و بەردی ماڵەکەیشم
پەشۆکاوی نیگاکانتە

پاسارییەکان دەنگیان نەما
دنیا تەواو کش و ماتە

تکا ئەکەم دڵی پاکم
زوو بگەڕێوە ئەم هەوارە

ئەوەندە بێ بەزەیی مەبە
مەڵێ ماڵت بێ ئاسەوارە

بەڵێن ئەدەم کە هاتیەوە
هەموو شتێ وەک خۆی لێدێ

فەرشی ڕۆحم ڕائەخەم و
تۆش بەسەریا هەنگاو بنێ

٢٠٠٩/٩/١٨
**هەولێر**

ئەگەر ڕۆژێک تۆ نەبینی
زۆر شێواوو کز و ماتە

دار و بەردی ماڵەکەیشم
پەشۆکاوی نیگاکانتە

پاسارییەکان دەنگیان نەما
دنیا تەواو کش و ماتە

تکا ئەکەم دڵی پاکم
زوو بگەڕیوە ئەم هەوارە

ئەوەندە بێ بەزەیی مەبە
مەڵێماڵت بێ ئاسەوارە

بەڵێن ئەدەم کە هاتیەوە
هەموو شتێ وەک خۆی لێدێ

فەرشی ڕۆحم ڕائەخەم و
تۆش بەسەریا هەنگاو بنێ

٢٠٠٩/٩/١٨
**هەولێر**

# ڕاستی و درۆ

واقم وڕماوە لە ڕاستی
بۆچی وەها بێ بەهایە

بۆچی ئەوەندە بەم شێوەیە
گرفتار و بێ نەوایە

هەر کە ڕاستی گوێ بیست ئەبین
گوێکانمان لە گۆ ئەچێت

ئەقڵ و چاو دڵ و هێزمان
بە تەواوی بێباک ئەبێت

سەیرە لوفزێکی درۆ
هەزار ووشەی ڕەوا بێنێت

تەنیا وەسفێکی ساختە
هەموو ناخمان ئەبزوێنێت

بە هەق تەواوو دا ڕووخاوم
بە ناهەقیش کەیف سازین

باش و خراپ لە یەک ناکەین
کەچی ئەڵێین وا ئوستادین

لەم ژیانە کەسیفەدا
ئەما ڕاستی و دەنگو باسی

وا درۆمانکرد بە قازی
بۆیە ئاوا لە خۆ باین

٢٠١٢/٥/٦

**هەولێر – لە کرێکاریدا**

## ماندووبوون بە دوایی کەسێکدا

چون
ئافرەتێک نیە
لەکاتە
مەینەتیەکانمدا
لە کاتی
دژوارو
بێ هیوا بوونەکانمدا
لەکاتی
گێژەڵوکە پڕ قەهرەکانمدا
سەرم

بخاتە سەر ڕانی و
لەم ئازارە کوشندەیە
بمپارێزێت
جارێکیتر
هیوای نوێبوونەوەی ژیانم
پێببەخشێت
وەک هاوڕێیەک
گوێ
لە نۆتە بێزارکەرەکانی
ژیانم بگرێت
وەک ئازیزێک
بە وەفا و بە ئەمەک بێت
لە بوون و نەبووندا
لە گەڵم بێت
لە ڕێگا باریک و سەختەکاندا

دەستم بگرێت و
لە جێی کوێرێک
لە جەنگەڵخانەکاندا
تووڕم نەدات
وەک هەتیوێک
سەیرم نەکات
لەجێی
بوکەڵەیکی بێ کەڵک
تووڕم نەداتە نێو
شەقامەکان
نێو
زێرابوو سەر
سەر کەوانە بێ نەواکان
تووڕم نەداتە نێو
زاووڵە بێ شەرمەکان

نێو گەنجە لچ قرچا و
هەوەس بازەکان
ئافرەتێکم دەوێت
لە کاتە نا هەموارەکاندا
لە گەڵم بێت
لە ژێر یەک چەتردا
لەبەر بارانی بەهاردا
دەستم بگرێت و
لە نێو سرووشتە جوانەکاندا
باسی
عەشق و خۆشەویستی خۆیم
بۆ بکات
باسی سرووشت و
دەردە دڵیم لا بکات
بەڵێنی پێکەوە بوونی

تا دوا تنۆکی ژیانی خۆیم
بۆ بکات
له شەواندا
له شەقامە تەنیاکاندا
بەیەکەوە
گوزەر بکەین
بەخەندەوە
له چاوە خەماوییەکانم
بڕوانێت
بەنازەوە
ئەم
شورای دڵەم
بشکێنێ
تەواوی
ئارەزوو مەینەتیەکانم

لە ژێر
گڵ نێت
ئافرەتێکم ئەوێت
لە کاتی
ماندوبوونەکانمدا
بەشێوەیەکی جوان و
پێکەنینەوە
سڵاو بکات
دەست بخاتە سەر ملم و
بە لێوە گەرمەکانی
ئەم لێوە بەستەڵەکەم
گەرم بکاتەوە
کە وەک
دەریا
بەستەڵەکان

بەستووێتی
وەک
کەشتیوانێک
ئەم دڵە
وون بووەم
لە نقووم بوون
بپارێزیت و
لەنگەری پێ بگرێت
گشت
زەخم و ژووار و خەمەکانم
دابگرێت و
بیفرۆشێت بەو
کەسانەی کە
هرمەت و
پارەیان لا جوانە

بیفرۆشێت
بەو کەسانەی
کە لوت بەرز و
نەفس نزمن
بەو مرۆڤانەی
کە ژیان و
جەستەی خۆیان
بۆ
دوو عانە
دەفرۆشن.

٢٠١٣/٦/١٧

# من شێتم

لە بوونمەوە تا
نەبوونم
من شێتم
چون گەڵا
زەردە
وەریوەکانی
پاییزم
خۆش دەوێت
چون
بەدوایی شەقامە
پێخاوسەکانی
تەنیایی دام
ئەو شەقامانەی
کە گرت

مرۆڤە دوو ڕوو
درۆزنەکانی
لێ تۆراوە
ئەو مرۆڤە دوو ڕوو درۆزنانەی
لە گشت
شوێنێکی ئەم شارەدا
شوێنیان هەیە
لە شوێنە جوان و
دڵ ڕفێنەکاندا
بوونیان
هەیە
لە دامو دەزگا حکومیەکاندا
دەستیان هەیە

من شێتم
چون بە دوایی
بێ ئومێدی
مرۆڤەکاندام

ئەو بێ ئومێدیەی
کە ناخمانی
هەژاندووە

وەک منداڵێکی ساوا
خۆم بە قەدیا شۆڕ دەکەمەوە
کەچی ئەویش
بە شەق و زلـلـەوە
تووڕم دەدات
تووڕم دەداتە نێو
پاشەڕۆی مرۆڤە
درۆزنەکان
ئەو مرۆڤەی خۆی
بە ڕاستگۆ ئەزانێت و
ڕاستیەکانی پێ باشە
کاتێک دەمم دەکەمەوە و
باسی
ڕاستی و ڕاستگۆیی بۆ دەکەم

دەبێتە گڕ
دەبێت بە ئاگر
سەرتاپا
جەستەم دەسوتێنێت

ئەوەندە بێزار ئەبێت
تا لە پاشەڕۆکانی خۆی
تووڕم دەدات
تووڕم دەداتە
نێو
زورک و
زەلکاوەکانی
ژیان
نێو مرۆڤە کەسیف و
پیاوە سۆزانیەکان
لە پاشانیش
بە خیانەتکار و
بە دوو ڕوو بە درۆزن

ناوم ئەبات
بە جۆرێک ناوم ئەبات تا
کەسایەتی خۆیم
لێ وون دەکات

تێناگەم
تێناگەم بۆ ڕاستیەکانم
وەک و خەون و خەیاڵ
وایە
لە هەمان کاتدا
درۆی خەڵکی لە جێی
گوڵ و چیمەن دایە

من شێتم
چون لەم مرۆڤە نا بەجێی و
نا ڕەسەنانە ناکەم
حەز لە ڕەفاقەتی
نێو پارک و بازارەکانیان

ناکەم
بە خەندە و پێکەنینەوە
خۆیان بە هاوڕێ و
خزمی لە مێژینەم دەزانن
خۆیان بە برا و
دۆست و نەجیب زادە
دەزانن
لە پاشانیش
بە سانایی
لە بیریان کردم
دمای گەیشتنیان
بە ئاواتیان وەک
زارۆکێک
سەیریان کردم
زارۆکێک
کە باش و خراپ
لێک ناکاتەوە

سەیرە من شێتم
چون بە ڕامانەوە
لە شتە گیاندار و بێ گیانەکان
دەڕوانم
بە تامەزرۆوە
لە دەشت و
دۆڵ و چیا و بیابانەکان
دەڕوانم
لە کفنی مردووان و
خراپی مرۆڤەکان و
قۆڵبڕینیان
دەڕوانم

کاتێک دەڕوانمە
سواڵکەری
نێو شەقام و ترافیکەکان
کۆڵبەرە بە تەمەنەکان و
میوە فرۆشی نێو

کۆلانەکان
شین و وا وەیلای
دایکە جەرگ
سوتاو کوڕە هەتیوەکان
دەستی
ماندووی
کرێکارە
هەژار و بێکەسەکان
مووچەی
پێشمەرگە جوامێر ونەبەردەکان
مووچرکە
بە جەستەمدا دێت و
مووەکانی جەستەم گرژ دەبنەوە
سرووشک لە چاوەکانم
ناوەستێ و
شیعرێک
دەهۆنمەوە

شەوێک نیە
لە بێداری لە
ئارووز دا
نەتوێمەوە

من شێتم
چون دەمەوێت
لە تەنیایی بمێنمەوە
لەم
تەنیاییەی کە
بەدڵێکی گەورەوە
ئامێزی بۆم کردۆتەوە
بە دڵێک
کە کەس
بیری لێناکاتەوە
وەک
کیسەلێک لە بیاباندا
نەسورێمەوە

وەک جاڵجاڵۆکەیەک
بە تەنیایی
هێلانەکەم دروست دەکەمەوە
چۆن قالۆچەیەک
کە قشپلێک بۆ لانەکەی
غرۆر دەکاتەوە
خۆم لەم ژوورە تەنیاییەدا
غرۆر دەکەمەوە
هیچ کەسێک
ئەم
داد و ناڵە یەی
من
نا بیستێت
هیچ وجودێک
گوێ لە نۆتە بێزارکەرەکانی
ژیانم
ناگرێت.

هەولێر ٢٠١٤/١/٩

## سبەی جەنگە

بوخچەی
کۆچم
کۆکردۆتەوە
تفەنگم خاوێن
جلەکانم پاک
سەرتاپای جەستەم
بۆن خۆشە

بە چەپلە و پێکەنینەوە
ئەچم
بەرەو
پیلی
مەرگەوە

ئەچمە لای
کاروانی وولات
سنگم قەڵغانە
بۆ
کوردستان
ئاوڕ لە دووا نادەمەوە
هیچ
بیرم
لای
سەرکردەی
دز و
پیاوی ترسنۆک و
ڕەزیل نیە
بیر لە مەلای
خوبا پێداو
ناکەمەوە
ئاوڕ لە دوا

نادەمەوە
بیرم نیە لای
کوڕی سەرکردە
گەندەڵەکان
بیرم نیە لای
کچە پارە پەرستەکان
هیچ بیر لە
خاک فرۆشانی کوردستان
ناکەمەوە
بیر لە لاوانی دەم درێژ و
زۆر ڕەوو
ناکەمەوە
گەرچی ئەزانم
زۆر چاک ئەزانم
شوێن خوێنی ڕژاووم
ئەدرێتەوە بە
دووژمن

شوێن خوێنم ئەکرێت
بە تەواڵێتی
دووژمن

من پێشمەرگەم
بە گیان بەخشین
بست بە بستی نیشتیمان
ڕزگار دەکەم
سەرکردەکانیشم
وەک قومارچییەکی سەرخۆش
لە سەر مێزێکی سێ کەسی
ئەیدۆڕێنن

سبەی جەنگە
وێنەکانم دابەش دەکرێت
بەسەر

خزم و دۆست و ناسیا و
هاو سەنگەرانمدا
لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکاندا
باس لە کەسایەتی و باشیم
ئەکەن
ئەو کەسانەی
دڵیان
شکاندووم
لە پاش مله
باسیان کردووم
بوختانیان بۆ هەڵبەستووم
وەک شێت ناویان بردووم
لە ناخەوە
دووژمنیان بووم
وێنەکانم پۆست دەکەن
باس لە نەبەردی و قارەمانیم
ئەکەن

باس لە باشی و بێدەنگیم
ئەکەن
چۆن
من مردووم
ئەوان ئەزانن
جارێکی تر
زیندوو نابمەوە
من ئەزانم
جارێکی تر
نایانبینمەوە
چۆن
دوای بیست ساڵ
لە بێکەسی
لە تەنیایی و
لە سەختی ژیان و
لە ئازار و ژاندا
تۆوامەوە

نە خزمێک
دەنگی لێوەهات و
نە کەسێک هات
بە هانامەوە
دوای بیست ساڵ
پرسەکەم
جمەی دێت لە
خەڵک
لە دووری سەدان کیلۆمەتر
دێن بۆ پێشوازیم
هەر زوو تەرمەکەم دەشۆن
زوو گۆڕم بۆ ئامادە
دەکەن
خزم و ناسیا و هاوڕێیانم
شەڕیانە لەسەر
تابووتەکەم
دەم و چاوی تازە

ئەبینم
فرمێسکی
پەشیمانی و
سۆز تێکەڵ
ئەبێت
هەر زوو کفن و دفنم
ئەکەن
هەر زوو جەستەی ساردم
دائەپۆشن
شەڕیانە تا کەمێک خۆڵ
زیاتر بکەن بەسەرمدا
مەلا زوو تەڵقینم ئەدات
هێمن هێمن
جمەی خەڵک
کۆتایی دێت
دوای هەفتەیەک
لە بیر ئەکرێم

سەر گۆڕم
پڕ ئەبێت
لە دڕک و گیا
تەواوی حەشەراتەکان
ئەبنە باشترین کەسی
سەر گۆڕم
مار
ئەبێتە خۆشەویستم
کێلی گۆڕم
ئەبێتە
تەلاری
جاڵجاڵۆکە
هیچ کەسێک
نایەتە
سەردانم
جگە لە خوێن و
گۆشتم

کەس بیرم لێناکاتەوە
ئەو کات دەڵێم
ئیتر
تەواوو
ئیشق و وەفای
خونچە گوڵ
تەواوو
ڕزگار بوونم
لە مرۆڤ
تەواوو
لە تانەی
هاوڕێ و
خزم و
دولبەرم
تەواوو
لە قسە نەزانی
مرۆڤەکان

تەواو
ئیتر
تەواو
هەموو شت
تەواو
تا ڕۆژی دوایی
دڵ شکان و
لوت بەرزی مرۆڤ
تەواو.

٢٠١٦/٨/٢٠
لە پێشمەرگایەتیدا - گوێر
دوای شەڕێکی سەختی نەوکات چەند هاو سەنگەرێکی
قارەمانم
لە دەستدا.

## قەسیدەی ساڵێک

ئەم ساڵم
خۆ هیچ بوو
هیچ
ئەم ساڵم
نە خەندە بوو
نە خۆشی
نە پیاسەی شەوان و
نە سەربەستی جارانم
نەبوو
وەک
شەمشەمە کوێرەکان
لە شوێنە
تەنگ و باریک وپەناکاندا

خۆم بە سەقفی خانووەکاندا
هەڵدەواسی
خۆم
بە تەنافی
نائومێدی دەناسی
لە نێو کوچەو کەلاوەکاندا
دەخوولامەوە
لە نێو
زبڵدانە باشەکاندا
ئەمامەوە
هیواو خۆزگەکانم
وون بوون وون
وەک ئاواتی باوکم
بە بـــا چوون
وەک دوکەڵی حەشیش
بێ ئامانج بوون
وەک پاسارییە بێ لانەکان

بێ لانه بوون
ئەوەندە بێزاربووم
له بێ ئیشی
له نەگبەتی
له بێ کاتی
له پیاسەی سەر
شەقامەکان و
نێو پارکەکان
نێو بازاڕ و
مرۆڤە نیکۆرەکان
لەسەر کورسی
چایخانە سارد و بێ هەستەکان
له بێ چرکە و بێ چرپەی
تەپیایی ژیان
وەک گەندەپەپویەکی
خەواڵوو
که هەزاران ماجەلای

بەسەر هاتبێ
ئەوەندە بێزار بووم
شەقم لە پاشماوەی
جگەرە و
نامەی عەشقە
بێ هەستەکانم
دەدا
شەقم
لە پەرتوکی
قوتابخانە
بێ ئامانجەکانم
دەدا
شەقم دەدا
لەو خاکەی
کە نامگرێتە خۆی
بە دەنگێکی بەرز
هاوارمدەکرد

ئیتر بەسە...
دەبەسە ئەی خودایە
تۆ حەقیت و حەقم دەوێ
ئەو هەقانەم دەوێت
کە چەندان جارە
زیندان کراووم و
زیندانت کردوون
بەسە چیتر...
چاوەڕوانی
دە بمدەوە
دەبمدەوە با سەر لە نوێ بژێمەوە
دە بمدەوە
با سەر لەنوێ
لە نێو کانی و سرووشت و
نیشتیمانە بێ کەسەکەمدا
گوزەر بکەمەوە
با خۆم وەک تفلێک لێبکەمەوە

بە هەستی ناسک بیلاوێنمەوە
چکۆ لە غوربەتا نیشتیمانم
نۆزیەوە
بە ئازارەکانی خۆم
دەیناسمەوە
دەپێم بڵێ ئەی خودایە
تاکەی
هاوڕێی
بێکەسی بم
تاکەی
لە پۆلی یارانا
نەبم
تاکەی
لە مەدرەسەی
عیرفانا
نەبم
تاکەی

نوور
له ئەوینی
هاورێیان
بم
تاکەی
بێ
سۆزی
دایک و
باوک
بم
ئەی خودایە
تۆ
ئەزانیت کوێم
ژاندەکا
تۆ
ئەزانیت
ئەم ناڵەیەم

بۆ چیە و بۆ کێم ئەبات
تۆ
ئەزانیت
ئەم بێکەسییەم لە کەس
ناچێت
لە باڵندەیەکی
باڵ شکا و
بێچوەکی بێ لانە
ئەچێت
لە
نیشتیمانێکی وێرانە و
پیاوێکی ستەم لێکرو
ئەچێت
بێکەسیەکەم
بووە
بە
ژەهر

و
ناخم
ئەخوات
خانەکانی لەشم ئەبا
چاوم کوێر ئەکا و
دڵم سوفتە ئەکا
هێز
لە دەست و
ئەژنۆکانم ئەبا

ئەم تەنیاییەم
لە بولبولێکی نێو
قەفەس ئەچێت
بۆت ئەخوێنم و
لە ڕۆژ هەڵاتەوە دێت و
لە ڕۆژ ئاواوە دەر ئەچێ

وەک بیلێکی هەڵاتوو
لەم شار
بۆ ئەو شار
لەم دێ
بۆ
ئەو دێ
هەر چەند ئەکەم
چەند هەوڵئەدەم
دڵ
بێ
ئارامە و
ئۆقرە ناگرێت

ئەی خودایە
من شوێنێکم ئەوێت
زۆر سادە وساکار بێت
تروسکەیەکی هیوای

تێدابێت
هیوایەک بە قەت
ڕووناکی
دەنکە شقارتەیەک
بە قەت
پاشماوەی
تەمەنی کۆتایی
مۆمێک
هیوایەکم پێ ببەخشە
بەقەت کونی دەرزیەک
تا بە توندی
لە باوەشی بگرم و
ڕزگارم بێت
ڕزگارم بێت لەو
هەموو نائومێد و
بێ هیوا بوونە
لەم ژیانە سەر سەخت و

وێڵبوونە
شوێنێکم دەوێت
نا ئومێدی
باڵنەکێشێت
بەسەر
دڵی
مرۆڤەکاندا
شوێنێکم دەوێت
ئەو
هەرنە و وەهەرنانەت
وەک ئاسکێکی
وەرەو گومکەرنەن
تا بەشوێن
ئاخ و زاری وزەخم و
گوڵە وەریوەکانی تەمەندا
بگەڕێم

ڕێگەمدە
ڕێگەمدە وەک مێروولەیەکی
ماندوونەناس
ئاسەواری هێلانە ڕووخاوەکەم
کۆبکەمەوە

ئەی خودایە
من ئەمەوێت
لەم ئاپۆڕایە ڕزگارم بێت
من ئەمەوێت
بۆ نوێبوونەوە
بۆ دەستپێکردنەوە
هیوایەکم هەبێت
بۆ چونە ڕیزی میرخاسان
هۆکارێکم ئەوێت
بە
گڕۆزانەوە

من ئەمەوێت
لەم ژیانە نەنگینە
ڕزگارم بێت
ڕابردووەکان لە بیرکەم
داهاتووەکانم لە بیربێت
شکستەکانم
بنێژم و سەرکەوتووەکانم
زیندوو بێت
تا بتوانم
هەوای
ئازادیم
بۆ
بێت

ئەی خودایە
شەرتبێت ئەم شەو
لەم زیندانە وێرانەدا

لەم وولاَتە ناکامەدا
وەک دایکە شەهیدێک و
ژنە ئەنفالێک
دەست بەرەو ڕووی تۆ
هەڵبڕم و یەخەم
دادڕم
تەواووی سەر گوزشتەکانی
تەمەن
تەواوی ئەشکەنجەی ژان و
قەتیس ماوەکانی سەردڵم و
ساڵێکی بە فیرۆ چووی تەمەنم
بنووسمەوە
دەنگی
ئەو
سەگە دڕە
بێزاریکردووم و
خەوم لێناکەوێ
پێکەنین و مەی خواردنەوەی

پاسەوانەکانی ئەوییوی
تەلبەندەکان
بێزارم
دەکات
گریانی
ئەو
منداڵە
هەژار و
نەخۆشە
ئەمگرێنێ
کە باوکی
بە دیارییەوە
دانیشتووە و
دەترکێنێ
هەست
بە خەم و ڕقو و
کینەی
ئەم بەندکراوە

هەژارانە
دەکەم
وەک چۆن هەست
بە
خەم و ڕقی خۆم
ئەکەم
ئەم
خەم و ڕقەی
کە چەندان ساڵە
لە ناخمدا دەیجومەوە
هێندە ئازاری داووم
تا کەسایەتی خۆمم
وون کردووە
وەک
وونکردنی دەرزییەک لە
کاانێکدا
زۆر مەحاڵە بیدۆزمەوە

دەپێم بڵێ
تۆ
پێم بڵێ
ئەی خودایە
من ئەتوانم چیبکەم؟!
من ناتوانم
ئەم ساڵانە
لەبیرخۆمی
بەرمەوە
بۆیە شەکوام لای تۆیە
ئەتوانیت خۆرا خرامکەیت
ئەشتوانیت چارەیێ
لە
حاڵم کەیت.

٢٠١٢/١٢/١٥
زیندانی تورکیا - تیکرداغ